**شێرزن:** شێرەژن، ژنی ئازا و بوێر

**شێرزور:** زۆردار، بەهێز، ئەوەی وەك شێر بەهێز بێت

**شێرژیان:** شێری ژیان، تووڕە، شێری دڕەندە

**شێرسگ:** شێرە سەگ، سەگی ئازا و بەهێز

**شێرسوار:** شێرسوار، ئەوەی سوار شێر بێت

**شێر شرزە:** شێری تووڕە، شێری دڕەندە

**شێرشکار:** بوێر، ئەوەی شێر شکار بکات، ئازا، نەترس

**شێر علم:** شێرئالاّ، وێنەی شێر کەلەسەر ئالاّ دایان نابێت

**شێرفش:** شێرئاسا، وەك شێر، شێرانە

**شێرفهم کردن:** تێگەیاندن، حاڵی کردن، تێگەیاندنی بابەتێك بەمناڵێکی کەم مێشك و نەزان

**شێرك:** شیرە، گوشراوە، دۆشاو، شیرەی تریاك

**شێرکچی:** شەراب فرۆش، عارەق فرۆش، خاونی مەیخانە

**شێرکخانە:** مەیخانە، نادی، شوێنی خواردنەوە

**شێرگیاه:** شیرەی گیا، ئەو شیرەی لە قەدی گیادایە

**شێرگیر:** شێرگر، ئەوەی بتوانێت شێر ڕاو بکات

**شێرلان:** شێرەلاّن، هێلانەی شێران، ئەو شوێنەی شێری زۆری لێبێت

**شێرمان:** شێرانە، شێرئاسا، وەك شێر

**شێرماهی:** شێر ماسی، ماسی گەورە

**شێرمرد:** شێرەپیاو، ئازا، بوێر، دلێر

**شێرمگس:** جارجاڵۆکە، جڵجاڵۆکە چونکە مێش دەخوات

**شێروا:** بڕوانە شیربا

**شێروار:** شێرانە، شێر ئاسا، هاوشێوەی شێر

**شێر و خورشید:** شێر و خورشید، نیشانی کۆنی دەوڵەتی ئێران کە بریتی بو لە شێرێکی وەستاو بە شمشێرێك لەدەستی ڕاست و خۆرێك کەلەپشتیەوە دەدرەوشایەوە

**شێروش:** شێرانە، کوڕانە، شێرئاسا

**شیرە:** ئاومیوە، گوشراوی میوە، شیرەی میوە

**شێر یاخط:** شێر یاخەت، جۆرێکە لەقومار کەبە سکەی دووڕوو دەکرێت کە دیوێکیان شێرە و ئەویتریان خەتە

**شیرین:** شیرین، شریناهی، ئەوەی وەك شیر بێت یا تامی شیر بدات، هەر شتێك کەتامی شەکر بدات. ناوی ژنێکە کەخوسرەو پەرویز عاشقی بو و بە ژنی هێنای

**شیرین دهن:** شیرین زمان، شیرین دەم، ئەوەی دەم و لێوی جوان و خۆشەویستی هەبێت

**شیرین زبان:** زمان شیرین، قسە خۆش، خۆش قسە، ئەوەی قسە و وتەکانی خۆش بێت

**شیرین سخن:** قسە خۆش، وتە خۆش، قسە شیرین، زامن شیرین

**شیرین شمایل:** جوان، شۆخ، شەنج، قۆز، دەلال

**شیرین گوار:** بەتام، بەچێژ، تامدار، ئەوەی تام چێژی خۆشی هەبێت

**شیرینی:** شیرینی، هەر شتێك کەتامی شەکر بدات

**شیرینی پز:** شیرینی پەز، ئەوەی شیرینی دروست دەکات

**شیرینی خوردن:** شیرینی خواردن، شەکراو خواردن، ڕێ و ڕەسمی مارە بڕین و دیاری کردنی کچێك بۆ کوڕێك

**شیزفرنی:** شیزۆفێرنی، شێتی ئاژەڵی

**شیشك:** مەڕی شەش مانگە یا یەك ساڵە، شەك، بەران

**شیشلە:** سست، لاواز، بێ هێز، شل، ئەوەی دەست وپێی سست و بێهێز بێت

**شیشە:** شووشە، شیشە

**شیشەباز:** فێڵباز، فریوکار، دەغەلکار، تەڕدەست

**شیشەبر:** شووبڕ، شووشەچی، ئەو کەسەی کاری بڕینی شووشە و جێ خستنیەتی

**شیشەکار:** شووشەچی، شوشەبڕ، ئەوەی شووشە دروست دەکات، شووشە ساز

**شیشەگر:** بڕوانە شیشەساز

**شیشە گردان:** فێڵباز، فریوکار، دەغەلکار، تەشقەڵەچی

**شیشە گردن:** نەحمەق، نەزان، گێژ، وڕ، کاس

**شیطان:** شەیتان، ئەهریمەن، یاخی، ئیبلیس، ڕۆحی ناپاك، دێو، دێڤ

**شیطنت:** شەیتانی کردن، سەرکێشی کردن، نافەرمانی کردن، یاخی بون، بەدفەڕی

**شیع:** لایەنگران، شوێن کەوتوان، هاوڕێیان، هاوەڵانی کەسێك

**شیعە:** شیعە، دەستە، بەرە، جوێ بووەوە، لایەنگرانی عەلی و دوانزە ئیمامەکەیتر کەباوەڕیان وایە خەلافەت دوای پێغەمبەر دەبێت لە عەلیەوە دەست پێ بکات

**شیفتن:** شەیدابون، پەرێشان بون، سەرگەردانی، شڵەژەان

**شیفر:** ژومار، شمارە، دەرەجە، نمرە، رەمز، هێما، نیشانە

**شیك:** شیك، شەنگ، شۆخ، دەلال، قۆز

**شیكپۆش:** شیك پۆش، خۆش پۆش، ئەوەی جل و بەرگی جوان و رازاوە دەپۆشێت

**شیكران:** بڕوانە شوكران

**شیگار:** بێكار، بێگار، کاری بێ کرێ، کاری زۆرەملێ

**شیلان:** سفرە، سفرەی خواردن کە چەندین جۆری خواردنی لەسەر چنرابێت

**شیلان:** شیلان، شیلانە، جلێق، داری، بەری دارێکی درکدارە

**شیلم:** گەنمە شێتە، دانەی گیایەکە لە جۆ باریکتر و سوورباو، گەنمە تاڵە

**شیلینگ:** شڵەنگ، سۆندە، لوولەی پلاستیکی بۆ جێبەجێ کردنی ئاو لەناو ماڵ

**شیلە:** بڕوانە شیلم

**شیلە:** شیلە، فریو، فێڵ، کەڵەك

**شیلینگ:** شیلینگ، پارەی وردی ئینگلستان

**شیم:** خاڵدار

**شیم:** خوو، خەدە، عادەت، سرشت، سروشت

**شیماء** خاڵدار، ژنی خاڵدار

**شیمە:** خوو، خولق، عادەت، سرشت، سروشت

**شیمی:** کیمیا، زانستێکە کە لە تایبەتمەندی مادەکان و شی بونەوە و پێکاهتەوە و کاریگەری ئەوان لەسەر یەك دەکۆڵێتەوە

**شیمیایی:** شیمیایی، کیمیایی، تایبەت بە کیمیا

**شیمی دان:** کیمیا زان، ئەوەی لە زانستی کیمیادا شارەزایە

**شیمیست:** بڕوانە شیمی دان

**شین:** عەیب کردن، ئیراد گرتن، عەیب لە کەسێك دۆزینەوە، ناحەزی، قێزەونی، دزێوی

**شینتو:** شینتۆ، مەزهەبی رەسمی دەوڵەتی ژاپۆن

**شیو:** شیو، سەرەوخواری، بەرەو خواری

**شیوا:** شیوا، زمان پاراو

**شیوا:** شیوا، ناوی یەکێك لەخواکانی هیندو، خوای وێرانکەر

**شیوخیت:** پیربون، بەساڵاچون

**شیوع:** بڵاو بونەوە، دەرکەوتن، ئاشکرا بون

**شیون:** شین، گریان، گریان و رۆڕۆ، شین و شەپۆر، ناڵە، هاتوهاوار، گریان لەکاتی بەلاً

**شیوە:** شێوە، شێواز، رێ، چۆنیەتی، رێباز، رێچکە، یاسا، نەریت، رێگە

**شیویدن:** ئاوێتە بوون، تێکەڵ بوون، قاتی بوون

**شیهم:** ژیژك، ژیژو، ژیشك

**شیهە:** حیلە، کوران، کوڕین، حیلەی ئەسپ

# ص

**ص**: پیتی حەفدەهەم لە ئالفابێتی زمانی فارسی، ئەم پیتە لە زمانی کوردیدا نیە و لە جیاتی ئەوە (س) بەکار دەبرێت

**صائب**: راست و دروست، راست، رێك، ماف

**صائحه**: شین و شەپۆڕ، گریان بەسەر مردوو، بانگی گریان و خەم

**صائم**: رۆژووگر، بەڕۆژوو، ئەوەی هەمو رۆژەکانی ساڵ بەرۆژوو دەبێت

**صائمه**: بەرۆژوو، ژنی رۆژوودار، ئەو ژنەی هەمو رۆژەکانی ساڵ بەرۆژو دەبێت

**صائن**: پارێزەر، پاسەوان، چاودێر

**صابر**: بەسەبر، خۆڕاگر، بەتاقەت، پشوودرێژ، ئارام، ئۆقرەگیر

**صابون**: سابوون، ساون، پاك کەرەوە، مادەیەکە بۆ پاك کردنەوە جەستە و جل و بەرگ کەڵکی لێوەردەگرن

**صابون پز**: سابونساز، سابونزی، سابونکەر، ئەوەی سابون دروست دەکات

**صابونی**: سابونکەرن سابون فرۆش، سابونچی

**صابونیه**: ئەسپۆن، جۆرە گیایەکە کەف دەکات، سەرشۆر

**صابی**: هەڵگەڕاوە، وەرگەڕاو، ئەوەی پشت دەکاتە دینەکەی خۆی و باوەڕ بە دینێکیتر دێنێت

**صاحب**: خاوەن، خێوی، ماخۆ، ماڵخۆ، خودان

**صاحب اختیار**: خاوەن دەسەڵات، خودان، لەسەردەمی قاجاریەکان یەکێك لەنازناوەکان بوە

**صاحب اسرار**: رازدار، خاوەن سڕ، ئەوەی راز و سڕ دەپارێزێت

**صاحب افسر**: تاجدار، خاوەن تاج

**صاحب اقتدار**: دەسەڵاتدار، خاوەن دەسەڵات

**صاحب الجیش**: سوپاسالار، فەرماندە

**صاحب امتیاز**: خاوەن ئیمتیاز، کەسێك کەلەلایەن دەوڵەتەوە مۆڵەتی کەڵك وەرگرتن لە کان یا لە شوێنێکی هەیە

**صاحب تجربه**: بەئەزموون، ئەزموندار، شارەزا، پسپۆڕ

**صاحب تصرف**: خاوەن، خێوی، خودان، ئەوەی توانای خۆهەڵقورتاندنی لەکار و بارێکدا هەیە

**صاحب تمیز**: عاقڵ، بیرمەند، تێگەشتوو، زانا، فرمزان

**صاحب جا**: خاوەن شکۆ، پایەدار، خاوەن پلە و پایە

**صاحب جمال**: جوان، دەلال، رازاوە، شۆخ، شەنگ

**صاحب خانه**: خانەخوێ، خاوەن ماڵ، خواوەندی ماڵ، مێهڤاندار

**صاحب خبر**: ئاگادار، زانا، دانا، هەواڵدەر

**صاحب خرد**: بیرمەند، عاقڵ، زانا، دانا

**صاحب خیر**: چاکەکار، خێرخواز، ئەوەی کاری خێر لەبەرژەوەندی خەڵك دەکات

**صاحب درد**: بەئازار، دەردەدار، بەلا بەسەر هاتوو، ئەوەی دەرد و ئازاری هەیە

**صاحب دل**: ١ -بەدڵ، بەجەرگ، بوێر، دلێر، بوێر ٢- خاناس، خۆپارێز، خواپەرست، لەخواترس

**صاحب دلق**: کۆنەپۆش، دەروێش کە جل و بەرگی کۆنە لەبەر دەکات

**صاحب دولت**: ١ - بەختەوەر، کامەران، بەبەخت، بەشانس ٢- خواناس، پارێزکار، خۆپارێز، لەخوا ترس

**صاحب رأی**: خاوەن دەنگ، خاوەن بڕوا، ئەوەی ڕا و بوچونی هەیە

**صاحب سخن**: خاوەن قسە، بێژەر، وتاردەر، وتارخوێن

**صاحب سر:** رازدار، نهێنی پارێز، ئەوەی راز و نهێنی دەپارێزێت، خاوەن بەڵێن

**صاحب سریر:** خاوەن تەخت، پاشا، دەسەڵاتدار

**صاحب سنگ:** بەرێز، رێزدار، سەنگین

**صاحب شریعت:** خاوەن شەریعەت، خودانی شەرع، پێغەمبەری ئیسلام

**صاحب عزا:** پرسەگێڕ، خاوەن پرسە، ئەوەی یەکێك لەخزم وکەس و کارەکەی لەدەست دابێت

**صاحب عنوان:** پایەدارن خاوەن ناونیشان، خاوەن پلە و پایە

**صاحب عیال:** مناڵدار، خوەان ماڵ، خاوەن ماڵ و مناڵ، ئەو کەسەی ژن ومناڵی هەبێت

**صاحب غار:** هاورێی غار، نازناوی ئەبوبەکەر کەهاورێ لە گەڵ پێغەمبەر لەئەشکەوتەکەدا مایەوە

**صاحب غرض:** خاوەن مەبەست، ئەوەی مەبەستێکی هەیە

**صاحب فراش:** نەخۆش، لەجێدا کەوتوو، ئەو نەخۆشەی لەجێدا کەوتبێت

**صاحبقران:** ساحیبقڕان، بەختەوەر، بەشانس، خۆشبەخت، کامەران

**صاحب قلم:** نوسەر، سکرتێرە، خاوەن قەڵەم

**صاحب قیاس:** بڕوانە صاحب رای

**صاحب کار:** خاوەن کار، بەڕێوبەر

**صاحب کرم:** بەخشەر، دڵۆڤان، ئەوەی توانایی بەخشینی هەبێت

**صاحب کلاه:** خاوەن تاج، تاجدار، پاشا، کولاڤدار، تانجدار

**صاحب کمال:** زانا، بیرمەند، ئەدیب، خاوەن زانست

**صاحب کمر:** خاوەن تاج، پاشا، تاجدار

**صاحب مال:** خاوەن ماڵ، ساماندار، بەتوانا، دەوڵەمەند

**صاحب مرده:** هەتیو، باوك مردوو، خاوەن مردوو، بێ سەرپەرەست، ئەوەی گەورەکەی مردبێت

**صاحب منصب:** پلەدار، خاوەن پایە و پلە، پایەبەرز

**صاحب نظر:** ۱- خاوەن دەنگ، خاوەن بڕوا، ئەوەی خاوەنی بیر و بۆچوونی تایبەت بەخۆیەتی۲- لەخواترس، پارێزکار، خۆپارێز ۳-پایەبەرز، پایەدار، جوان پەسەند، ئەوەی جوانی بەلاوە پەسەندە و وەسفی دەکات

**صاحب نیاز:** نیازمەند، نیازدار، دەست کورت، هەژار

**صاحب ولایت:** پێشەوا، گەورە، سەرپەرەست، سەرۆك، سەروەر

**صاحب همت:** خاوەن ئیرادە، بەبڕشت

**صاحب هنر:** هونەرمەند، خاوەن هونەر، خاوەن بەهرە

**صادر:** ناردن، هەناردن، ناردنەدەر، دەرکرد. نێردراو، بەرامبەری هێنراو

**صادع:** بەجێ هێنەر، ئاشکراکەر، داوەر، دادوەر، ئەوەی لەنێوان خەڵکدا نێوەنجیگەری بکات

**صادق:** راستگۆ، راستبێژ، راست، دروست، دیار، ئاشکرا، باوەڕپێکراو

**صادقانه:** راستگۆیانە، راست، راستبێژانە، وەك راستگۆکان

**صادقه:** بڕوانە صادق

**صارم:** شێر، شیری دڕندە، دلێر، ئازا، بوێر، چاونەترس

**صاروج:** بڕوانە ساروج

**صاع:** پەیمانە، پێوانە، کێشانە، پێوانەیەکە کەحوکمە ئیسلامیەکانی لەسەر دەکرێت و هاوتایە لەگەڵ سێ کیلۆ گرام

**صاعد:** سەرکەوت، بەرزەفڕ، ئەوەی لەخوارەوە بۆ سەرەوە دەڕوات، بەرزەوە بو

**صاعقه:** تریشقە، هەورەبروسکە، هەورەتریشقە، بروسکە، ئاگرێك کەلەهەورە بروسکە دروست دەبێت

**صاعقه آسا:** هەورەبروسکە ئاسا، تریشقە ئاسا، وەك تریشقە لەتوندی و خێرایی و ئاگر

**صاغر:** پەست، سووك، ئەوەی بەهەر پەستی و سووکیەك رازی بێت

**صاف:** ساف، پاك، بێگەرد، بێ خەوش، برچەفان، خاوێن، بێ غەش، بێ ریا، بێ رازاندنەوە، سادە، ساکار، رێك، بێ چرچ و لۆچ،

**صافات**: مەلایکە، فریشتەکان

**صافکاری**: صافکاری، ساف کردنی چرچ و لۆچی جل و بەرگ یا نارێکی شتێك

**صافی**: ۱- پاك، بێ ریان روون، بێ غەش، بێگەرد ۲- ساق، برنج پالێو، ئەو دەفرەی کونی ورد وردی هەیە و بۆ ساف کردن و پالاوتنی هەندێ خواردن کەڵکی لێوەردەگرن

**صافی درون**: ناخ پاك، ویژدان پاك، دڵ پاك، ئەوەی دڵ دەرونی پاکە و بێ گرێیە

**صافی دل**: دڵپاك، دڵ ساف، بێ کینە، ساف و رون

**صافی شدن**: پاك بونەوە، پاقژ بونەوە، خاوێن بونەوە، بێ ریا بون

**صالح**: ساڵح، چاکەیکار، چاکەخواز، چاکە ویست، شیاو

**صالحه**: ژنی چاکەکار، ژنی پاك، چاکەخواز. بەمانای کرداری چاك و ئاکاری باشیش دێت

**صامت**: ۱- بێدەنگ، ئارام، کوژاوە، هێمن ۲- زێر، سیم

**صانع**: ئافرێنەر، دروستکەر، داهێنەر، پێشەوەر، پیشەگەر، ئەوەی بەدەستی خۆی شتێك دروست دەکات

**صب**: رشتن، رژاندن، رژانن، رشتنی ئاو

**صبا**: سەبون، سەبا، بای رۆژهەڵات

**صبا**: ۱- حەز، ئاسە، ئارەزو، خواست، ویست ۲- مناڵی، منداڵی

**صبا**: حەزکردن، ئارەزوومەند بون بە ئەنجامدانی کاری منالانە، مناڵی، کەم تەمەنی

**صباح**: سەرەتای رۆژ، بەرەبەیان، کازیوە، کازێوە، ئەلەند

**صباح**: صەباح، ناوی باوکی حەسەن پێشەوای ئیسماعیلیە

**صباحت**: جوانی، دەلالی، رازاوەیین شەنگین شۆخی

**صبار**: خۆڕاگر، پشوودرێژ، بەسەبر، بەتاقەت

**صبار**: تەمەرهیند، هەنجیری هیندی

**صباغ**: رەنگ، ئەوەی شتێکی پێ رەنگ دەکەن، بۆیە

**صباغ**: ۱- رەنگرەز، رەنگرێژ، بۆیەکەر، بۆیەچی، رەنگ ساز ۲- درۆزن، فشەکەر، درۆکەر

**صباغت**: رەنگ رشتن، پیشەی بۆیەچی

**صبان**: سابون چێکەر، سابون فرۆش، سابونکەر، سابونساز

**صباوت**: مناڵی، دەورانی منداڵی، زارۆکێنی

**صبح**: بەیانی، بەرەبەیان، سەرەتای رۆژ، سپێدە

**صبح آسا**: روون، رووناك، وەك بەیانی رووناك

**صبحانه**: نانی بەیانی، ناشتایی، قاوەڵتی

**صبح بام**: بەیانی زوو، بەرەبەیان، سەرەتای رۆژ

**صبح خوان**: بولبول، ئەو مەلەی لەبەیانیدا دەخوێنێت

**صبح خیز**: خەووسوك، ئەوەی بەیانیان زوو لەخەو هەڵدەستێت

**صبحدم**: بەرەبەیان، سەرەتای رۆژ، کازیوە، ئەلەند، سپێدە

**صبحدمان**: بڕوانە صبحدم

**صبح رو**: سپین ئاسك، رووسپی، روخسار سپی، ئەوەی روخساری وەك بەیانی زو روون بێت

**صبح سعادت**: بەیانی بەختەوەری، سەرەتای بەختەوەری

**صبح فام**: روون، بەڕەنگی بەیانی، سپی، روون، رۆشن

**صبح فش**: بەیانی ئاسا، وەك بەیانی

**صبحگاه**: بەرەبەیان، بەیانی، سەرەتای رۆژ، لەکاتی بەیانیدا

**صبح نشین**: خەوو سوك، ئەوەی بەیانیان زو لەخەو هەڵدەستێت

**صبح وار**: سپی، رۆشن، وەك بەیانی

**صبح وش**: بڕوانە صبح فش

**صبر**: سەبر، تاقەت، خۆڕاگرتن، پوودرێژی، بەتاقەت بون، خۆ گرتن

**صبر**: ۱- ناوچە، کەنارەی شتێك، قەراغ ۲- هەوری سپی

**صبغ**: رەنگ کردن، رەنگ کردنی جل و بەرگ یا هەرشتێکیتر

**صبغه**: رەنگ، ئەو شتەی شتێکیتری پێ رەنگ دەکەن، بۆیە

**صبوت**: نەزانی، بێ ئاگایی، منداڵی، زارۆکێنی

**صبوح:** هەر شتێك كەلەبەیانیدا بیخۆن وەك شیر و شەراب، ناشتایی

**صبور:** خۆڕاگر، بەتاقەت، بەبڕشت، خۆگر، پشودرێژ، هێمن

**صبی:** منداڵ، مێرد منداڵ، منداڵی بچوك، زارۆك

**صبیان:** منداڵان، زارۆكەكان

**صبیح:** رووسپی، روخسار سپی، ئەوەی روخساری سپی و رون بێت. جوان، شۆخ، شەنگ، دەلال

**صبیحه:** ژنی جوان، شۆخ و شەنگ، دەلال

**صبیر:** ١- خۆڕاگر، پشودرێژ ٢- گەورە، سەروەر و دەستەبەری هۆز

**صبیه:** كچ، كیژ، كەنیشك، كچی منداڵ

**صح:** تەندروست بوون، ساغی، لەش ساغی، باش بونەوە، چاك بونەوە، راست بوونەوە

**صحابت:** هاودەمین هاوڕێ، هاوڕێیەتی، هاوەڵ بون

**صحابه:** هاوڕێیان، یاران، هاوەڵان، هەڤاڵان. بە هاوڕێیانی پێغەمبەری ئیسلامیش دەڵێن

**صحاح:** باشبونەوەن چاكبونەوە، تەندروست بون، لە نەخۆشی رزگاربون

**صحاح:** تەندروست، ساغ، بێ عەیب، راست، بێ هەڵە

**صحاری:** سارا، ساراكان

**صحاف:** چاڵاو، ئەو چاڵانەی ئاوی تیا كۆدەبێتەوە

**صحبت:** هاودەمی، هاوڕێیەتی، گفتوگۆ، وتوێژ، قسە، ئاخاوتن، ئاخفتن، هاوەڵایەتی، هاونشینی، دەمەتەقە

**صحت:** تەندروستی، لەش ساغی، باش بونەوە، چاك بونەوە، ساغ بونەوە

**صحراء** سارا، بیابان، زەوی پان و بەرین و بێ ئاو و گیا، دەشت، بیاوان، شەپاڵ، مخمر، ئاران

**صحراگرد:** بیابان گەڕ، ساراگەڕ، سارانشین

**صحرانشین:** سارا نشین، بابان نشین، چادرنشین، خێوت نشین، ئەوەی لەسارا و لەژێرخێوەتدا ژیان بەسەر دەبات

**صحرانورد:** بیابانگەڕ، ساراگەڕ، ساراپێو، ئەوەی لەسارا و بیاباندا دەگەڕێت

**صحراوی:** ساراوی، تایبەت بە سارا

**صحفه:** دیس، لیس، دەوری گەورە كە برنجی تێدەكەن

**صحن:** ١- حەوشە، ناوحەوشێ، ناوەڕاستی ماڵ و حەوشە ٢- دەوری، دیس، لیس

**صحنه:** ١- زەوی رێك، پانتایی بەربلاو ٢- دیمەن، شوێنی نمایشت

**صحو:** نەمانی مەستی، دەرهاتن لەسەرخۆشی، بەردان، بەئاگا هاتنەوە، ٢- وشیاری، ئاگایی ٣- ساف، بێ هەوربونی ئاسمان٤- ساماڵ، رۆژی بێ هەور، ئاسمانی بێ هەور

**صحیح:** راست، بێعەیب، تەندروست، ساغ، سلامەت، دروست

**صحیفه:** نامە، وەرەقە، لاپەڕە، كتێب، پەرتووك، رۆژنامە

**صخره:** تاشەبەرد، بەردی گەورە

**صد:** سەد، ژومارە سەد، ١٠٠

**صد:** رێگرتن، نەهێشتن، بونە لەمپەر، گەڕاندنەوە

**صدا:** دەنگ، ئاواز، بانگ، دەنگێك كەلەكەژ و كێودا بزرنگێتەوە و دوبارە بەر گوێ بكەوێتەوە

**صدارت:** لەپێشی، لەسەرەوە دانیشتن، راوێژكار، سەرۆك وەزیر

**صداسنج:** دەنگ پێو، ئامێرێكە بۆ پێوانە كردنی بەرز و نزمی و لەرینەوەكانی دەنگ

**صداع:** ژانەسەر، ئازاری سەر، سەرئێشە

**صداق:** مارەیی، مارەیی ژن

**صداق:** هاوڕێ بون، هاوەڵایەتی، هاوەڵی، هاوڕێیەتی پاك و بێ ریا

**صداقت:** راستی، پاكی، هاوڕێیەتی پاك و بێ ریا

**صدام:** ژانەسەر، سەرئێشەی چوارپێكان. ئازاری نیوەی سەر

**صداندرصد:** سەد لەسەد، لەسەدا سەد، بەتەواوی، گشتی

**صد برگ:** سەد بەرگ، سەد گەڵا، گوڵی سوور، گوڵی زەرد، گوڵێك كە بەرگەكانی زۆر بێت

**صدپا:** سەد پێ، هەزار پێ

**صدپاره:** لەت لەت، شەق و شڕ، پینە پەڕۆ، ئەوەی دڕاوی و پینەی زۆری پێوە بێت لە جل و بەرگ

**صد تو:** سەد توێن سەد لا، ئەوەی توێ یا لاکانی زۆر بێت

**صدد:** ١- رووبەڕوو، بەرامبەر، روودەڕو ٢- نێردراو، نامەبەر

**صدر:** ١- سینە، سکی مرۆڤ ٢- سەرەتا، سەرەتای شتێك، لەپێش، سەرەوە، پێشەوا

**صدرنشین:** ئەوەی لای سەرەو دادەنیشێت، پێشەوا، لەپێش، سەروەر، سەرۆك

**صدره:** ١- سینە، سینگی مرۆڤ، سك ٢- پێلەك، سوخمە، بەربوودی، فووتك، سینەبەند، سینەپۆش، جلێکی بێ قۆل کەسینەی دادەپۆشێت

**صد شاخ:** بڕوانە صدپاره

**صدصد:** سەد سەد، سەسە، سەد دانە سەد دانە

**صدع:** ١- قەڵشتن، کەڵشتن، دووبارە دروست کردنەوە، ئاشکرا کردن، دەرخستن، دیار خستن ٢- کەڵشت، قڵیش، تڵیش، دڕاوی ٣- دەستە، گروپ، تاقم، جەماعەت

**صدف:** سەدەف، سب، گوێچکە ماسی

**صدف وار:** سەدەف ئاسا، وەك سەدەف

**صدف وش:** سەدەف ئاسا، وەك سەدەف

**صدق:** ١- راستگۆیی، راست وتن، راست بێژی، درۆنەکردن ٢- راستی، دروستی، پاکی

**صدقه:** خێر، خێرات، ئەوەی لەرێگای خوادا بە فەقیر و هەژاری بدەن، سەگۆر، گاوگەردون

**صدقه:** مارەیی، مارەیی ژن

**صدم:** ١- کوتان، لەیەك دان، لەیەك کوتان، بەتوندی لێدانی دو شت لەیەك ٢- گەشتن، هاتن، دروست بون، دەرکەوتنی کارێکی گەورە و گران

**صدمه:** ١- دوورخستنەوە، تاراندن، دەرکردن ٢- کوتان، لەیەك دانی دوشت بۆ یەك جار ٣- زیان، بەڵا، ئازار، قۆرت، چۆرتم، چەپۆکی رۆژگار

**صدور:** ١- روودان، روودانی کار یاباببەتێك، ئاشکرا بون، دەرکەوتن ٢- گەڕانەوە، فەگەریان

**صدوق:** راستگۆ، راست بێژ، ئەوەی هیچ کات درۆ ناکات

**صدید:** ١- چڵك، کێم، کێماو، هەو، زووخ، زەرداو، خوێناو، جەراحەتی برین ٢- ناڵە، فریاد، هاوار

**صدیع:** ١- بەرەبەیان، کازیوە، ئەلەند ٢- نیوە، نیمە، نیوە لە هەر شتێکی دو نیو کراو

**صدیغ:** لاواز، سست، بێهێز، پیاوی بێهێز و سست. منالی حەوت رۆژە

**صدیق:** یار، هاوڕێ، هاوەڵ، هەڤاڵ، هاودەم، دەستەبرا، دۆست

**صدیق:** راستگۆ، راست بێژ، درۆنەکەر

**صدیقه:** ژنی چاکەکار و هاوڕێ

**صراح:** پاك، بێگەرد، بێ غەش، ساف و پاك

**صراح:** دەرکەوتن، ئاشکرا بوون، رووبەڕوو قسە کردن، دۆزرانەوە

**صراحت:** بێ گرێ، بێ گرێ و گۆڵ، بێ ریا، ئاشکرا، بە ئاشکرا قسە کردن، بێ پێچ و پەنا ئاخاوتن

**صراحی:** سوراحی، تۆنگ، تۆنگی شەراب یا ئاو

**صراحیه:** شەراب، شەرابی پاك و بێ غەش، قسەی راست، بێ گرێ، قسەی بێ پێچ و پەنا

**صراحیه:** بڕوانە صراحی

**صراخ:** فەریاد، هاوار، بانگ، قیژە، سەخت، خرۆش

**صرار:** فەریاد کەر، هاوارکەر

**صراط:** رێگەی راست. و ناوی پردێکی زۆر باریك کە دەڵێن باریکترە لەمو لەو دنیا کەخەڵکان بەسەریدا تێدەپەڕن و هەر کەس گوناحکار بێت لێی دەکەوێتە خوار

**صراع:** زۆران گرتن، زۆرانبازی، باوەش بەیەکا کردن

**صراف:** زێرناس، ئاڵتونچی، دراوگۆڕەوە، ئەوەی پارەی باش و خراپ لەیەك جیادەکاتەوە

**صرام:** ١- یەکێك لەناوەکانی شەڕ، بەڵا، گرفتاری، گیرۆدەیی ٢- بەبڕشت، بوێر، چاوقایم، نەترس

**صرام:** چەرم فرۆش، پێستە فرۆش، ئەوەی چەرم و پێستە دەفرۆشێت

**صرامت:** تیژبون، نەترسان، بوێری، ئازایەتی، چاو قایمی، بەجەرگی، زاتداری

**صرح:** کۆشك، تەلار، باڵەخانە، بینای گەورە

**صرد:** ١- سارد، سەرد، سەرما، شوێنی بەرز لەکوێستان ٢- سادە، پاك، بێ گەرد وگرێ لەهەر شتێك

**صرصر:** سەرسەر، بای توند، بای سەخت، بای زۆر سارد، بای زەمەن

**صرصرتك:** تیژڕەو، بلەز، توندڕەو

**صرع:** فێ، فێ لێهاتن، گەشکە، پەرکەم، سەرسام، کەوتن، لەسەر زەوی کەوتنی کەسێك، نەخۆشیەکە بەهۆی گرژی و هەستی ئازار و سست بون لەناو دەمار و ئەندامەکانی جەستە دروست دەبێت و نەخۆش کتاوپڕ دەکەوێتە سەر زەوی و روخساری ڕەش و شین دەبێتەوە و بۆ ماوەی چەند خولەکێك وەك دار رەق دەبێت

**صرع:** وەك، وەکو، هاوشێوە، هاوتا، بەرابەر، یەکسان

**صرعدار:** پەرکەمدار، فێ دار، فێ یاوی، ئەوەی نەخۆشی پەرکەمی لەگەڵدا بێت

**صرع زده:** بڕوانە صرعدار

**صرعی:** بڕوانە صرعدار

**صرف:** گەڕاندنەوە، فەگەڕاندنن هێنانەوە، ناردنەوە، گەڕاندنەوەی ماڵێك بۆ کەسێك٢- چواندن، خەرج کردن، سەرف کردنی ماڵ و سامان٣- گۆڕینەوە، گۆڕینەوەی دراوێك بۆ دراوێکیتر

**صرف:** گەڕان، سووڕان، سووڕانی رۆژگار و زەمانە

**صرف:** صەرف، سەرف، زانستێکە لەوشە عەرەبیەکان دەکۆڵێتەوە

**صرف:** پاك، بێ غەش، پاك و بێ گەرد لەهەر شتێك، بێ گرێ

**صرف شدن:** خەرج کران، بەکار بران، کەڵك لێوەرگیران

**صرف کردن:** خەرج کردن، بەکاربردن، کەڵك لێوەرگرتن

**صرفه بردن:** سوود بردن، قازانج کردن، بەهرە گرتن

**صرفه‌جو:** دەسپێوەگر، ماڵدار، ئەوەی لە خەرج کردنی سامان و ماڵەکەی دەست پێوەدەگرێت

**صرفه‌جویی:** دەست پێوەگرتن، ماڵداری، کەم خەرج کردن، بیری دوا رۆژ بون، نیاتە

**صرم:** بڕین، پچڕاندن، قرتاندن، لەت کردن، بڕینی شتێك یا قسەی کەسێك

**صرم:** جەماعەت، دەستە، تاقم، گەرك، ماڵەکانی یەك شوێن

**صرنایه:** زڕنا، زوڕنا

**صرود:** سەردسێر، قشلاق، قشلاخ، زستانەوار، ئەو شارانەی هەواکەیان زۆر ساردە

**صروف:** رووداو، گەڕان و رووداوەکانی رۆژگار

**صره:** هەمیان، کیسەی پارە، جزدان، کیفی پووڵ

**صریح:** پاك، بێ غەش، خاوێن، پاقژ، پاك لەهەر شتێك، ئاشکرا، بێ پێچ و پەنا

**صریحه:** بڕوانە صریح

**صریر:** ١- هاوار کردن، نالاندن، قیژە کردن ٢- دەنگی پێنوس، ئەو دەنگەی لە کاتی نوسین بە قەڵەم لێی بەرز دەبێتەوە

**صریع:** کەوتوو، خراو، کەوتووە سەر زەوی

**صعب:** دژوار، دشوار، سەخت، گران، قورس، کاری سەخت و دژوار

**صعبوب:** دژوار، سەخت، کاری گران و قورس

**صعبه:** دژوار، قورس، گران، دشوار، سەخت، گیانبڕ

**صعتری:** کەریم، بەخشەر، بوێر، پیاوچاك، چاکەخواز، خێرخواز، چالاك، نەترس

**صعداء:** دژواری، سەختی، بەلا، زیان، دشواری

**صعداء:** هەناسەی سارد، هەناسەی درێژ، هەناسەیەك کەلەخەم یا بێزاری و هیلاکی لەسینە دێتەدەر، ئاخ، ئۆف

**صعرور:** جیوە، جیوەی دار کە وشك ببێتەوە

**صعق:** بێهۆش بوون، لە هۆش چوون، لەخۆچوون، لەخۆچون بەهۆی دەنگێکی گەورە و ترس بزوێن

**صعقه:** ١- بێهۆش بون، لەخۆچون، بێهۆشی بەهۆی ترس یا نیگەرانی٢- هەورەتریشقە، هەورە بروسکە، تریشقە

**صعلوك:** دەورێش، هەژار، نەدار، دەستكورت، نیازمەند

**صعوبت:** دژوار بون، دژواری، سەختی، گرانی، قورسی، دشواری

**صعود:** سەركەوتن، چوونەسەر، بەرزەوە بون، رۆشتنە سەر، رۆشتنە سەر لە كێو یا پیلكانە یا شتێتر

**صعوە:** چۆلەكە، هەر باڵندەیەك كە بەئەندازەی چۆلەكە بێت

**صعید:** ۱- خاك، هەرد، خۆڵ، خۆڵی سەر زەوی ۲- گۆڕ، قەبر، مەزار۳- رێ، رێگا ۴- زەوی رێك و خاڵی لەدار

**صغار:** سووك بون، سووكی، ریسوایی، پەستی

**صغار:** ورد، بچوك، چكۆڵە، بچكۆڵە

**صغارت:** بچوك بون، ورد بون، سووك بون، ریسوا بون، پەست بون

**صغر:** ۱- بچوك بون، بچوكی، كەم تەمەنی، مناڵی ۲- سووكی، ریسوایی، پەستی، ورد بون، شكان

**صغران:** ۱- ورد بون، سووك بون، ریسا بون۲- خۆرئاوا بون، ئەو دەمانەی خۆر لە ئاوابوندایە

**صغران:** ورد، بچوك، چكۆڵە، بچكۆڵە

**صغری:** بچوكتر، چكۆلەتر، ژنی بچوكتر

**صغو:** حەز، تاسە، تاسە كردن، ئارەزومەندی، ئامەزرۆیی، خوازیاری

**صغیر:** ورد، بچوك، كەم تەمەن، بچكۆڵە، چكۆلانە، مناڵێك كەهێشتا نەگەشتبێتە تەمەنی بلۆق

**صغیرە:** ورد، بچوك، چكۆلانە، كەم تەمەن.

**صف:** ریز، رەدە، سەف، راستە، هێڵی راست

**صفا:** ساف بون، پاكی، خاوێنی، بێ ریایی، بێ گەردی، پاك و خاوێنی، پاقژی، بێگەردی

**صفات:** تایبەتمەندی، تایبەتمەندیەكان

**صفاح:** بەخشەر، ئەوەی لە گوناح وتاوانەكان خۆش دەبێت

**صفادادن:** بریقەدانەوە، پا كردنەوە، خاوێن كردنەوە، ئاودان بۆ بریسكانەوە

**صفاكردن:** سازان، هەڵكردن، گونجان، ئاشتی كردن، شادی كردن

**صفاهان:** ئیسفەهان، ناوی یەكێك لەشارەكانی ئێرانە

**صف بستن:** ریز بەستن، سەف بەستن، لە ریزدا وەستان، پشت سەری یەك وەستان

**صفت:** ۱- وەسف كردن، پیاهەڵگوتن، پیاهەڵنان، رێز بۆ دانان، بە چاكە باس كردن ۲- تایبەتمەندی، چۆنیەتی، چەندایەتی، حاڵەت، وشەیەك كەچۆنیەتی و چەندایەتی كەسێك یا شتێك بگەیەنێت

**صفح:** پشت تێكردن، روو سوڕاندن، ئاوڕنەدانەوە، خۆشبون، لەگوناح خۆشبون، لێخۆشبون

**صفح:** ۱- لا، كەنار، رەخ، تەنیشت، كەنار، تەنیشت كەسێك ۲- روخسار، رواڵەت، دەم و چاو۳- پانایی شمشێر

**صفحە:** رو، روی شتێك، لاپەڕە، كاغەز، وەرەقەی كتێب، هەر كام لە لاپەڕەكانی كتێبێك

**صفدر:** دوژمن شكێن، ئەوەی ریز و سەفی دوژمن دەشكێنێت، ریز شكێن، شەڕكەر، بوێر، دلێر

**صفر:** سفر، ناوبەتاڵ، بۆش، خاڵی، پوچ، هیچ، بێ ناوەرۆك. هێمایەك لەشێوەی نوكتە(.) كەلەخۆیدا ژمارە نیە بەڵام ئەگەر لە لای راستی هەر ژمارەیەك دابنرێت ئەو ژمارە دەبەرابەر دەكات

**صفر:** سەفەر، مانگی دوەم لە ساڵی كۆچی

**صفر:** زێر، ئاڵتون، تەلا

**صفر:** ۱- زەردوویی، نەخۆشی زەردوویی ۲- برسیەتی، برسی بون

**صفرا:** زەرد رەنگ، هەر شتێكی زەرد رەنگ، زەردباو. زەرداو، ئەو شلەمەنیە زەرد رەنگەی لە جەستەی مرۆڤ دێتە دەر، زەرداوە

**صفرازدە:** زەرد بو، وشك بو، رەنگ پەڕیو، ئەوەی لەنەخۆشیدا رەنگی زەرد بوبێت

**صفراكردن:** تووڕە بون، توند گرتن، توند و تیژی

**صفراوی:** توند و تیژ، تووڕە، رق ئەستوور

**صفرت:** زەردی، رەنگی زەرد

**صفر و سرگردان:** سەرگەردان، ماڵ بەكۆڵ، ئاوارە، دەربەدەر، سەرسووڕماو، واق وڕماو

**صف زدن:** ریز بەستن، لەریزدا وەستان، سەف بەستن

**صف شکن:** ریز شکێن، دوژمن شکێن، ئەوەی ریزی سوپای دوژمن دەشکێنێت، دلێر، شەرکەر، ئازا، نەترس

**صفصاف:** بی، دارەبی، هەر جۆرە دارە بی یەك

**صفصف:** زەوی تەخت و بێ گیا، هامون

**صفصف:** باڵندە، چۆلەکە

**صفع:** زللە لێدان، شەقەزللە لێدان، شەپازلە لێدان، بەبەری دەست کێشان بە دەم و چاوی کەسێکدا

**صفعه:** شەپازللە، شەقەزللە، زللە، بەبەری دەست کێشان بە پشتەمل یا دەم و چاوی کەسێك

**صفق:** ١- تا، تای درگا ٢- کەنار، رەخ، تەنیشت، قەراغ

**صفقه:** دەست دانەوە، دەست دانەوە لەکاتی پەیمان بەست و مۆر کردنی گرێ بەست

**صف کشیدن:** ریز بەستن، لەریزدا وەستان، پشت سەری یەك وەستان

**صفن:** پێستی هێلکە گون، ئەو پێستەی جووتە هێلکە گونی نێرینەی تیایە

**صفن:** سفرە

**صفو:** ١- ساف و روون بوون، رۆشن بوون، رۆشنی، روونـاکی ٢- هەڵبـژێردراو، بـژارتی، بـژاردە، پـاك و بژاردە لەهەرچی

**صفوان:** بەردی لووس، بەردی رێك و ساف

**صفوت:** پـاك، بـێ گـەرد، خـاوێن، پاقـژ، بـژاردە، هەڵبژێردراو

**صفه:** هەیوان، ئەیوان، شانشین، ژوور ئاسایەك لەناو ژوور یا پشتی مزگەوت کە شوێنی دانیشتنی چەند مس دەبێت، ماڵی هاوینە

**صفی:** دۆست، هاورێ، هاوەڵ، هەڤاڵ، هاورێی ئەمەکدار، پاك، هەڵبژاردە

**صفیحه:** شمشێری پان، بەردی پان، روی هەر شتێکی پان

**صفیر:** سووت، فیکە، فیقە

**صفیرزدن:** فیقە لێدان، فیکە کێشان

**صفین:** سەفین، شەری سەفین، ئەو شەرەی لەنێوان سوپای عەلی کوری ئەبی تالیب و سوپای مەعاویە کوری ئەبو سوفیان روویدا کە نزیکەی ٧٠ هەزار کەس لە هەردوولا کوژرا

**صقع:** ناحیە، ناوچە، گۆشە، سووچ، گۆشەی زەوی

**صقل:** پاك کردنەوە، بریقە پێدانەوە، درەخشان کردن، خاوێن کردن بۆ بریسکەدانەوە

**صقیل:** ئاودراو، بەبریقە، ئەوەی ئاودرابێت و ببریسکێتەوە

**صك:** قەباڵە، قەواڵە

**صك:** لێدان، کوتان، سەخت لێدان و کوتانی شتێك

**صکاك:** قەباڵە نوس، قەواڵە نوس، ئەوەی قەباڵە لەنێوان دوکەسدا دەنوسێت

**صل:** ١- شمشێر، شمشێری تیژ ٢- بەلا، دژواری، تەنگ و چەڵەمە، شواری ٣- و جۆرە مارێکی زەرد رەنگ

**صلاء** ئاگر، ئاتەش، ئاگری گەورە، ئەو ئاگرەی خۆی پێ گەرم بکەنەوە

**صلابت:** سەخت بون، سەختی، بەهێزی، خۆراگری، بەبڕشتی

**صلات:** نوێژ، دۆعا، پارانەوە، تەسبێح، نوێژ و دۆعای بەندەکان بۆ خوا

**صلاح:** ئاشتی کردن، سازان، ئاشتی، هەڵکردن، گونجان

**صلاح:** چاکەکاری، چاکەخوازی، خێرخوازی، خێر، دژی خراپە و شەڕ

**صلاح اندیش:** خێرخواز، چاکەخواز، خێرئەندێش، خێرۆمەند

**صلاح دید:** بە باش زانین، لە بەرژەوەندیدا بینین، بەرەوا زانین

**صلاحیت:** شیاوی، شایانی، شیاوبون، ژێهاتن، لێهاتن، پێکەوتن

**صلاحیتدار:** شیاو، شایان، شیاو و دەسەڵاتدار بۆ ئەنجامدانی کارێك

**صلب:** ٢- لەداردان، هەڵواسین، لەداردانی کەسێك ٢- برژانن، برژاندنی گۆشت

**صلب:** ١- توند، سەخت، درشت، بەهێز ٢- ئێسقانی پشت، بڕبڕەی پشت، کەمەر

**صلبوت:** سەلبوت، ڕۆژی لە خاچدانی عیسا

**صلبیه:** سپێنە، سپێنەی چاو

**صلح:** ئاشتی، کۆکی، تەبایی، گونجان، هەلکردن، سوڵح. لەناو دەستەواژە سیاسیەکاندا بەمانای دەست هەلگرتن لەشەڕ و بەستنی ڕێکەوتن نامەی ئاگر بەست دێت

**صلحاء** چاکەکار، چاکەخواز، خێرخواز

**صلح جو:** ئاشتی خواز، ئەوەی بەدوای ئاشتیدا دەگەڕێت، ئاشتی ویست

**صلح کردن:** تەبابون، ئاشتی کردن، هەلکردن، گونجان، سازان، کۆك بون

**صلح گونه:** ئاشتی ئاسا، ئاشتی کاتی لەبەر بەرژەوەندیی تایبەت

**صلحنامه:** ئاشتی نامە، پەیمان نامەی ئاشتی، ڕێکەوتنێك کەلەنێوان دوکەس یا دو ولآت دا مۆر دەکرێت کە تیایدا هەردوکیان پابەند بونی خۆیان بۆ ئاشتی دەردەبڕن

**صلصال:** ژاکاو، سیس بو، وشك هەلآتوو، گوڵی ژاکاو و سیس بو

**صلصل:** ١- ناوچاوی ئەسپ، تەوێل، موی سپی پشتی ئەسپ ٢- پیالە، پەیمانەی بچوك ٣- شوان، شوانی شارەزا و لێهاتوو

**صلصله:** بانگ کردن، دەنگ لێوەهاتنی زەنگ یا خشڵ یا هەوسار

**صلع:** ڕووتانەوە، ڕویتانەوە، هەلوەرینی مووی پێشە سەر، تاسی، کەچەڵی پێشەسەر

**صلعاء** ١- کەچەڵ، تاس، بێ موو، ژنێك کەمووی ناوچاوی ڕووتابێتەوە ٢- سارای وشك و بێ ئاو و گیا

**صلعه:** پێشە سەر، پێشەسەر کە مووی پێوە نەمابێت

**صلف:** فشە کردن، خۆهەلکێشان، سنووور بەزاندن، تێپەڕین لە ئەندازە

**صلم:** لەبن دەرهێنان، لەڕەگ دەرکێشان، بڕینی گوێ یا لووت

**صلماء** گوێ بڕاو، گوێ دەرهێنراو، ژنێك کەگوێچکەیان لەبنا دەرهێنابێت

**صلوات:** سلآوات، دروود، ڕەحمەت، بەزەیی

**صله:** ١- پەیوەست بون، پەیوەند دران، پەیوەست بونی شتێك بە شتێکیتر ٢- بەخشین، پێدان و بەخشینی مال بەکەسێك

**صلی:** ئاگر، ئاگری گەورە وزۆر، ئاگر گرە، ئەوەی ئاگری پێدەکەنەوە لە پوش و پەلآش و چیلکە

**صلیب:** سەلیب، خاچ، داری عیسا، داری مەسیح، داری پیرۆز، ئەو دارەی عیسایان پێ لەخاچ دا

**صلیب:** ١- لەخاچ دراو، لەدار دراو ٢- توند، بەهێز، خۆڕاگر، توند و تیژ

**صلیب سرخ:** خاچی سوور، خاچی سووری نێو دەوڵەتی کە دامەزراوەیەکە بۆ هاوکاری کردن و بەهاناوەچونی لێقەوماوانی کارەسات لەناکاوەکانی ولآتەکان

**صلیب شکسته:** خاچی شکاو، هێمای نازیەکان لەئالمان کەهێمای ڕەسمی بونەم هێمایە لەکۆنەوە لەناو نەتەوە ئاریاییەکاندا باو بوە

**صلیبی:** خاچی، خاچ ئاسا، بەشێوەی خاچ، عیسەوی، مەسیحی، خاچ پەرستانە

**صلیح:** چاکەکار، چاکەخواز، خێرخواز، خێرۆمەند

**صلیل:** بانگ کردن، دەنگ لێوە هاتنی شتێکی کانزایی لەکاتی ڕاکێشان یابەرکەوتنی بە شتێك

**صم:** کەڕ، نەبیس، گوێ گران

**صماء** کەڕ، نەبیس، ژنی کەڕ

**صمات:** ١- بێدەنگ بون، کوژانەوە، ئارام بون، بێدەنگی، خامۆشی

**صماخ:** ناوگوێ، ناوگوێچکە، کونی گوێچکە، پەردەی گوێ

**صمان:** بەردەلآن، زەوی ڕەق و پڕ بەرد

**صمت:** خامۆش بون، بێدەنگی، خامۆشی، بێدەنگ بون، ئارم بون، قسە نەکردن، جووڵە نەکردن، جووڵە لەخۆبڕین

**صمد:** سەروەر، گەورە، بێ نیاز، تاقانە، تەنیا، ئەوەی هەموان نیازمەندی ئەون. و یەکێك لەناوەکانی خوا

**صمصام:** شمشێر، شمشێری بڕەر

**صمغ:** جیوە، جیوەی دار

**صمم:** کەڕی، نەبیستن، گوێ گرانی

**صموت:** بێدەنگ بون، خامۆش بون، جوولە لەخۆ بڕین

**صمیم:** ١- پاك، صاف، پاك و ساف لەهەر شتێك، بێگەرد ٢- توندی گەرما یا توندی سەرما

**صمیمانە:** هاوڕێیانە، دۆستانە، بێ ریایانە، لەرووی پاکی و راستیەوە

**صناعت:** پیشە، سەنعەت، کار یا پیشەیەك کە پێویستی بەشارەزایی و بیرکردنەوە بێت، هونەر، کردە

**صناعی:** دروستکراو، دەسکرد، بەرامبەر بەسورشتی، دروستکراوی دەست، خۆکرد، دەسکار

**صنایع:** پیشەسازی، پیشەکان

**صندلی:** سەندەڵی، کورسی، چوارپایەیی پشت دار بۆدانیشتن

**صندوق:** سنووق، سندوق، سنۆق، مجری

**صندید:** ١- گەورە، بوێر، ئازا، چاونەترس، سەروەر ٢- بای سارد، سەرمای وشك

**صنع:** دروستکردن، خولقاندن، بەرهەم هێنان، ئافراندن ٢- کار، کردەوە، پیشە، کردە ٣- چاکەکردن، هاریکاری کردن، بەخشین، یارمەتی دانی خەڵك

**صنعت:** پیشە، هونەر، کار، کردە

**صنعتکار:** پیشەگەر، سەنعاتکار، پیشەوەر

**صنف:** جۆر، شێوە، چەشن

**صنم:** بت، بوت، ئەوەی لەبەرد یا دار یا کانزا دەیتاشن و دواتر دەیپەرستن

**صنم کدە:** بتخانە، بوتخانە، شوێنی بوتەکان و پەرستین

**صنم گر:** بوت تاش، بت ساز، ئەوەی بت بۆ پەرستین و جوانکاری دروست دەکات و دایدەتاشێت

**صنو:** ١- برادەر، برا، دو کوڕ کە لەیەك باوك بن ٢- کوڕ ٣- دو یا چەند دار کە لەیەك بن روابێتن

**صنوبر:** سنەوبەر، دارێکی گەڵا دەرزیە بەرێکی لەبیچمی دڵی مرۆ دەگرێ

**صنوبر خرام:** دڵبەر، دەزگیران، خۆشەویست، دولبەر، دڵدارێك کە قەد و باڵای وەك سنەوبەر بێت

**صنوبری:** سنەوبەری، ئەوەی لەشێوەی سنەوبەردا بێت، سنەوبەر ئاسا

**صنیع:** ٢- دەسکرد، دەسکار، دروستکراو، پەروەردەکراو، شمشێری ئاودراو، جڵ و بەرگی پاك و خاوێن ٢- خێر، خێرات، ئەو خێر و خواردنەی لەرێگای خوادا دەیدەن ٣- شارەزا، لێهاتوو، لێزان، ئەوەی لەکار و پیشەی خۆیدا شارەزابێت

**صنیعە:** ١ هونەر، کاری باشە، چاکە، خێرات، پەروەردە کراوی دستی کەسێك

**صواب:** راست، دروست، بێ هەڵە، حەق، شیاو، شایان

**صوابدید:** مۆڵەت، رێگە، ئیزن، بڕوانامە

**صوابرای:** راست ئەندێشە، بیرمەند، عاقڵ، ئەوەی بیر و بۆچونەکانی راست بێت

**صواب شمردن:** بەراست زانین، بەچاکە زانین، رەوا دیتن، لەبەرژەوەندیدا بینین

**صواع:** جام، قاپ، پەرداخ، ئاوخۆری، دەفری گەورە کەئاوی پێبخۆنەوە

**صواغ:** درۆزن، درۆکەر، فشەکەر، ئەوەی بەدرۆ شان و باڵ بە قسەکانی خۆی بدات

**صواغ:** زێرگەر، زێرنگەر، ئاڵتونچی

**صواف:** پەشم فرۆش

**صوام:** زەوی وشك و بێ ئاو، وشکەلان

**صوام:** بەرۆژوو، رۆژودار، رۆژوگر، ئەوەی زۆر بەرۆژوو دەبێت

**صوان:** جێ جڵ، کومێد، سنوقی جل یا کتێب

**صوب:** ١- راست، دروست، بێ هەڵە ٢- لا، رەخ، کەنار، ناوچە، تەنیشت، قەراغ

**صوبە:** کۆ، کۆگا، کۆگای شتێك، کۆگای گەنم

**صوت:** بانگ، ئاواز، سەوت، دەنگ، ئاهەنگ، هەردەنگێك یائاوازێك کەبەگوێچکە بگات

**صور:** سوور، بۆق، شاخێك كەفووى تێبكەن و دەنگى لێبێتەدەر. نفخە صور، نەفخى سور، ئەو بايەيى ئيسرافيل لەرۆژى كۆتايى لە شەيپوورەكەى خۆى دەكات و مردوەكان زيندو دەبنەوە

**صورت:** ١- شێوە، جۆر، تەرز، شێواز ٢- روخسارن روو، دەم و چاو، روالەت، بيچم، ديمەن، قيافە، پەيكەر، نەخش

**صورت برداشتن:** پێرست هەلگرتن، پێرستى كەل و پەل مال يا شوێنێكيتر لەناو كاغەزێكدا نوسين

**صورت بستن:** بەخەيالدا هاتن، دروست بون، لە گوماندا دروست بون، شێوە گرتن، كران

**صورت بند:** وێنەكێش، نەقاش

**صورت بين:** روخسار بين، رووبين، ئەوەى تەنيا روالەت دەبينێت

**صورت پذير:** لەكران هاتوو، شێوە وەرگر، شياوى ئەنجام دران

**صورت پرست:** روخسار پەرەست، ئەوەى زۆر گرنگى بە جوانى روخسار دەدات و جوانى روخسارى خۆش دەوێت

**صورت حال:** چۆنيەتى، بارووددۆخ، حال و هەوال

**صورتخانه:** بتخانە، بوتخانە

**صورت دادن:** ١- شێوەدان، روخسار پێدان ٢- ئەنجام دان، بەكۆتايى گەياندنى كارێك

**صورت ساز:** نەقاش، وێنەكێش، نيگاركێش

**صورتكار:** بڕوانە صورت ساز

**صورتكده:** ١- نيگارستان، دامەزراوەى نەقاشى و پەيكەر سازى ٢- بوتكەدە، بتكەدە

**صورت كردن:** وێنەكێشان، نەقاشى كردن، نيگار كێشان

**صورتكش:** نەقاش، پەيكەر ساز، نيگاركێش، وێنەكێش

**صورتگر:** نەقاش، پەيكەرساز، نيگاركێش

**صورت گرفتن:** ئەنجام دران، ئەنجام درانى كار يا مامڵەيەك

**صورت نا پذير:** نەكران، لەكران نەهاتوو، ئەوەى شياوى كران نەبێت، ئەنجام نەدراو

**صورت نگار:** نەقاش، وێنەكێش، نيگار كێش

**صورتى:** پەمەيى، بەرنگى روخسار، سوورى رۆشن

**صور فلكى:** بورج، بورجەكان

**صورنگار:** نەقاش، وێنەكێش، نيگاركێش

**صورى:** روكەش، روالەت، تايبەت بەروو

**صوغ:** ١- ئافراندن، خولقاندن، دروستكردن ٢- رۆچوون، رۆشتنە خوارەوەى ئاو لەسەر زەوى ٣- وەك، وەكو، هاوشێوە، لێكچو، هاوتا

**صوف:** پەشم، تووك، پەشمى مەڕ

**صوفى:** سۆفى، ئەوەى شوێن كەوتووى ڕێبازى سۆفيەكان بێت

**صوفيانە:** سۆفيانە، هاوشێوەى سۆفيەكان، وەك سۆفى

**صوفيگرى:** صۆفى بون، سۆفيگەرى

**صول:** پەڕين، بازدان، هەڵمەت بردن، پەلاماردان

**صولت:** ١- پەڕين، پەڕين و پەلاماردان ٢- دەسەلات، زالبون، هێز، هەڵمەت بردن لەشەڕ

**صولج:** زيو، زوى بێ غەش، نوقرە

**صولجان:** گۆچان، داردەستى پاشايەتى

**صوم:** رۆژوو گرتن، بەرۆژوو بون، خۆ پاراستن لە خواردن وخواردنەوە لە بانگى بەيانيەو تا بانگى ئێوارێ

**صومع:** بڕوانە صومعە

**صومعگى:** دێرنشين، ئەوەى لەناو دێر و سەومەعەدا دادەنيشێت

**صومعه:** سەومەعە، دێر، كێو يا شوێنێكى بەرز كە راهيب يا خۆپارێز بۆ پارانەوە پەرستين لەوێ بەسەردەبات، خانەقا

**صومعەدار:** خۆپارێز، راهيب، لەخواترس، ئەو راهيبەى سەومەعەى هەبێت

**صومعه نشين:** راهيب، لەخواترس، ئەوەى لەناو سەومەعەدا دادەنيشێت بۆ پەرستين و پارانەوە

**صون:** ١- پاراستن، راگرتن، چاودێرى كردن ٢- راگرتنى شتێك، هەلگرتن

**صه:** بێدەنگ بە، قسە مەكە

**صهباء** سوور و سپی، سوور وس پی تێکەڵاو ۲- شەراب، شەرابی ترێ کەسوور باو بێت

**صهر**: ۱- نزیکی، خزمایەتی، ئاشنایەتی۲- زاوا، مێردی کچ یا مێردی خوشك

**صهروج**: بڕوانە ساروج

**صهریج**: ۱- حەوز، گۆلاو، ئەو چاڵەی ئاو تیا کۆببێتەوە ۲- بڕوانە ساروج

**صـهیب**: سوهەیب، یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر کەلەپارێزکاریدا بەناو بانگە

**صهیل**: کووڕان، کووڕین، حیلە، حیلەی ئەسپ

**صهیون**: سەهیون، ناوی کێوێکە لە باشوری ڕۆژئاوای ئورشەلیم کە مزگەوتی ئەقصی لەوێیە و هەندێ کاتیش بە ئورشەلیم دەڵێن سەهیون

**صیاح**: بانگ کردن، هاوار کردن، قیژاندن، بانگ، ئاواز، هاوار

**صیاد**: ڕاوکەر، نێچیرڤان، ڕاوچی، ئەوەی ڕاو دەکات

**صـیاغ**: ۱- درۆزن، درۆکەر، ئەوەی زۆر درۆ دەکات، ئەوەی بەدرۆ بە شان و باڵی قسەی خۆیدا هەڵدات ۲- زێڕینگەر، زێرگەر

**صیاغت**: زێڕینگەری، کاری زێڕینگەر

**صـیام**: ڕۆژو گرتن، بەڕۆژوو بون، خۆپاراستن لە خواردن و خواردنەوە

**صیام**: ڕۆژوڤان، ڕۆژودار

**صیانت**: ڕاگرتن، پاراستن، هەڵگرتن، چاودێری کردن

**صیت**: ناوبانگ، نێوبانگ، ناوی چاکە، ناوبردنی کەسێك بەچاکە لەلایەن خەڵکەوە

**صیحه**: ۱- بانگ کردن، هاوار کردن، نەڕە، قیژە ۲- ئازار، جەزرەبە

**صید**: ۱- ڕاو کردن، نێچیر کردن، شکار کردن، ئەوەی ڕاوی دەکەن

**صید آزما**: ڕاوچی، نێژیەڤان، شکارچی

**صید افکن**: بڕوانە صیاد

**صید بند**: بڕوانە صیاد

**صیدکار**: بڕوانە صیاد

**صیدگاه**: ڕاوگە، نێچیرگە، جێ ڕاو، شکارگە

**صیدگر**: بڕوانە صیاد

**صیدلانی**: دەرمان فرۆش، دەوا فرۆش، ئەوەی دەوا و دەرمان دەفرشێت، بۆتفرۆش

**صیدله**: دەرمانخانە، دەرمان فرۆشی، دەواخانە، شوێنی دەرمان فرۆشتن، کۆگای دەرمان

**صیرفی**: زێڕناس، زێڕنیاس، دراو گۆڕەوە

**صـیرورت**: گەڕانەوە، فەگەریان، هاتنەوە، گۆڕان، لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەرهاتن

**صیغه**: جۆر، چەشن، قیافە، بیچم، ڕواڵەت، هەر شتێك کە لەقاڵب درابێت. ۲- سیغە، ژنی کاتی، ژنێك کە بۆماویەکەی کاتی لە پیاوێك مارە دەکرێت

**صیف**: هاوین، وەرزی گەرما، تاوسان

**صیفی**: هاوینی، تایبەت بەهاوین، ئەو کشت و کاڵەی لەسەرتاکانی هاوین کارەکانی ئەنجام بدرێت و بەرهەمەکەی لە سەرتاکانی پاییز بەر بێت

**صیقل**: زاخاو دان، ئاودان، ڕەوارتن، تیژ کردن

**صیقل گـر**: زاخاوکەر، تیژکەر، ئەوەی چڵك و ژەنگی ئاسن و شمشێر بگرێت

**صینی**: چینی، تایبەت بەچین، لە خەڵکی چین، دروست کراوی چی

# ض

**ض:** پیتی هەژدەیەم لە ئالفابێتی فارسی. ئەم پیتە لە زمانی کوردیدا نیە و لەجیاتی ئەم پیتە (ز) بە کار دەبرێت

**ضائر:** زیان گەیەنەر، زەرەردەر

**ضائرە:** بروانە ضائر

**ضابط:** پارێزەر، بەڕێوبەر، راگر، بەهێز، دەسەلاتدار، وشیار

**ضابطە:** ١- راگر، پارێزەر ٢- یاسا، رێسا، دەستوور

**ضابي:** خۆڵەمێش، خۆڵەمێشی گەرم

**ضاجع:** خانە نشین، سست، تەمەڵ، پاڵ کەوتوو، ئەوەی لەسەر لا کەوتبێت یا خەوتبێت

**ضاحك:** ١- پێکەنەر، ئەوەی زۆر پێدەکەنێت، دەم بەبزە ٢- هەورە تریشقە، ئەو هەورە کە بروسکەی لەگەڵدا بێت

**ضاحكە:** ١- دەم بەپێکەنین. دەم بە بزە ٢- ئەو ددانانەی لەکاتی پێکەنین دەردەکەون

**ضاحي:** دیار، ئاشکرا، دەرکەوتو، ئەوەی هەتاو پێی بگات

**ضار:** زیان گەیەنەر، زەرەردەر، لەنێوبەر، خەساردەر

**ضارب:** ١- فێرزەون، ناحەز، دزێو ٢- ئەوی تاریك، ئەنگوستە چاو

**ضاربە:** بروانە ضارب

**ضارع:** رام، دەستەمۆ، لاواز، لەڕ، دالگۆشت

**ضارور:** نیاز، پێویستی، پێداویستی

**ضارورە:** ١- نیاز، پێویستی ٢- زەرەر، زیان، خەسار

**ضاغط:** ١- گوشەر، زەخت کەر ٢- پارێزەر، پاسەوان، ئەمین لەسەر شتێك

**ضاغوط:** مۆتەکە، خەوی ناخۆش، خەوی پریشان

**ضال:** گومڕا، لارێ، ئاوارە، لەرێ دەرچوو

**ضالە:** ون بوو، نوقم بوو، لەرێ دەرچوو

**ضامر:** کەم گۆتش، دالگۆشت، لەڕ، لاواز، لاغر

**ضامرە:** بڕوانە ضامر

**ضامن:** دەسبەر، تاوندەر، تاوان بژێر، وەرگر، لەخۆگر

**ضایع:** بێهۆ، بێ کەلك، بێ بەهرە، فیرۆ، گوم، خراپ، بزر

**ضایعە:** بەفیرۆ چو، بەخەسارچوو، لەناوچو، بەکەڵك نەماو، ئەو شتەی ئیتر کەڵکی کەڵگ وەرگرتنی نەبێت

**ضایق:** تەنگ، تەسك، ئەوەی زۆر پان نەبێت، تەنگەربەر

**ضب:** مارمێلك، مارمێلکە

**ضباب:** زباب، ناوی هۆزێکی عەرەبە

**ضباب:** تەم، تەم ومژ، هەورێکی تەنك کە زەوی داپۆشێت

**ضباط:** تۆمارکەر، ئەوەی وەرەقە و بەلگەنامەکانی ناو دامەزراوە یا رێکخراوێك بنوسێت و هەڵبگرێت

**ضبان:** مارمێلك، مارمێلکە

**ضبط:** پاراستن، گرتن و هەلگرتن، تۆمار کردن، راگرتن

**ضبط صوت:** تەسجیل، ئەو ئامێرەی بە کارەبا یا بە پیل کاردەکات و بەهۆیەوە دەنگ دەکەوێتە سەر شریت و بلاو دەبێتەوە، دەنگگر

**ضبع:** کەمتیار

**ضبع:** وشکەساڵی، ساڵی نەهات، قات و قڕی

**ضبعان:** کەمتیار، کەمتیاری نێر

**ضبعانە:** کەمتیار، کەمتیاری مێ

**ضبە:** مێچکە مارمێلك

**ضج:** بانگ کردن، نالاندن، هاوار کردن، شین و ڕۆڕۆ

**ضجاج:** ناڵاندن، هاوارکردن لەترس، بانگ کردن
**ضجاج:** جیوە، جیوەی دارێك کەشیاوی خواردن بێت
**ضجاج:** عاج، دیانی فیل
**ضجر:** ناڵاندن، بێقەراری کردن، بێ ئۆقرەیی، دڵتەنگ بون، دڵتەنگی
**ضجر:** مەلول، خەمبار، خەمۆك، دڵتەنگ
**ضجرت:** خەم، خەفەت، پەژارە، دڵتەنگی
**ضجور:** دڵتەنگ، خەمبار، خەمۆك، خەفەتبار
**ضجە:** بانگ و هاوار، شین و ڕۆڕۆ، گریان
**ضجیج:** ناڵاندن، هاوارکردن و گریان لەترس
**ضجیع:** هاوخەو، هاوجێ، هاوجێگە
**ضجیعە:** بڕوانە ضجیع
**ضحاك:** دەم بەبزە، دەم بەپێکەنین، ئەوەی زۆر و بەردەوام پێدەکەنێت
**ضحاك:** زوحاکی تازی دهاك، دوایین پاشای ئیمپراتۆری ماد
**ضحك:** کەنین، پێکەنین، خەنین
**ضحكە:** خەندە، پێکەنین، یەك جار پێکەنین
**ضحكە:** قەشمەر، ئەوەی خەڵك پێی پێبکەنن، گاڵتەجاڕ
**ضحوك:** دەم بەبزە، دەم بە پێکەنین، ئەوەی زۆر پێدەکەنێت
**ضحی:** ناشتایی، کاتی هەڵاتنی خۆر، بەمانای هەتاو و خۆریش دێت
**ضحیە:** ١- بەرزایی ڕۆژ، نیوەڕۆ، نیمەڕۆ ٢- قوربانی، مەڕی قوربانی
**ضخام:** ئەستوور، ستوێرن کوڵفت، کڵفەت، قەوی
**ضخامت:** ئەستووری، کوڵوفتی، ستوێری، قەڵەو بون، قەڵەوی
**ضخیم:** ئەستوور، گەورە، قەوی، ستوێر، کوڵوفت، مەزن، گەورە
**ضد:** نەیار، دژ، دوژمن، ناسازگار، ناهاوتا، قانەر، خەنیم
**ضدید:** ١- دژ، ناهاوتا، ناسازگار، دوژمن، نەیار ٢-وەك، هاوشێوە، هاوتا، وەکو، وەکی
**ضدین:** دودژ، دو دوژمن، دو شت کەنەیار و دژی یەك بن
**ضر:** ١- زیان گەیاندن، زەرەر لێدان، زیان گەهاندن ٢- زەرەر، زیان، خەسارەت، ٣- تەنگی، سەختی، دژواری، خراپی
**ضراء:** زیان، زەرەر، خەسارەت، بەڵا، وشکەساڵی، سەختی، دەست کورتی، دەست تەنگی
**ضراب:** شەڕەشمشێر، شەڕ کردن لەگەڵ کەسێك، شەڕ و پێکدادان
**ضراح:** لەقە وەشاندن، جووتە خستن، جفتەك خستن
**ضرار:** زیان لێدان، زیان گەهاندن، زەرەر لێدان، خەسارەتدان
**ضرارت:** کوێری، نابینایی، لەناوچوونی سۆمایی چاو
**ضراط:** تڕ لێدان، تڕ بەردان، بەڕەڵا کردنی بایی دەنگدار لە قن
**ضراط:** تڕکن، تڕ بەردەر، تڕلێدەر
**ضراعت:** گریان، شین کردن، لە خۆبوورین، ناتەوان بوون، سست بوون، سستی، شین و ڕۆڕۆ، گریان
**ضراغم:** شێر، شێرەکان
**ضرام:** ئاگر گرە، دەسەچیلەی ئاگر، چیلکە و چەوێڵ کەئاگری پێدەکەنەوە
**ضراوت:** تەماحار بون، چاوچنۆکی، ڕژدی، هۆگربون، خوو گرتن
**ضرب:** لێدان، کوتان، لێدانی سکە. لەناو دەستە واژە بیرکاریەکاندا بەمانای کەڕەت دێت کە یەکێکە لەچوار کردەوەی سەرەکی بیرکاری و ئەویش دووبارە کردنەوەی ژمارەیەکە لە ژمارەیەکیتر بۆ بەدەست هێنانی ژمارەیەك کە چەندین بەرابەری ئەو ژمارەیە
**ضرب:** ١- وەك، هاوشێوە، شێوە، چەشن ٢- وردە باران، نمە باران ٣- بیرتیژ، چالاك، ڕۆح سووك
**ضرب الاجل:** کات دیاری کردن، دوایین کات، ماوە بۆدانان، دیاری کردنی کاتێکی سنوردار
**ضرب المثل:** پەند، وتە پێشینان، نمونە هێنانەوە، چیرۆك هێنانەوە

**ضربان:** لێدان، لێدانی دڵ، تەپە تەپی دڵ، تەپین

**ضرب خوردن:** زیان بەرکەوتن، زەرە لێدران، بەلا بەسەردا هاتن، بریندار بون

**ضرب دیدن:** بروانە ضرب خوردن

**ضرب زدن:** زیان لێدان، خەسارەتبار کردن، بەلا بەسەر هێنان، بریندار کردن، زەرەر پێگەیاندن

**ضرب طرقتن:** تەپڵ لێدان، تەپڵ کوتین

**ضربە:** ١-لێدان، زەربە، یەکجار لەلێدان ٢- برین، زام، ناسوور

**ضرر:** زەرەر، کەم وکوڕی، ئیراد، زیان، خەسارەت، بەلا، سەختی

**ضرر زدن:** زیان گەهاندن، زیان لێدان، زەرە لێدان

**ضرر کشیدن:** زەرە کردن، زیان بینین، خەسارەت دیتن

**ضرس:** ١- دان، دیان، دندان ٢- نمە باران، وردە باران

**ضرس:** توند و تیژ، توورە، رقاوی، ئەوەی لەبرسیەتیدا توورە ببێت

**ضرطە:** تڕ، بایی دەنگ دار کە لە دواوەی مرۆڤ دەردەچێت

**ضرع:** گوان، گۆهان، گوانی مانگا مەڕ

**ضرع:** هاوتا، هاوشێوە، هاوجۆر، وەك

**ضرع:** ١- رام کردن، دەستەمۆکردنی ئەسپ ٢-رام بون، دەستەمۆ بون ٣- لەخۆبووردویی، گریان، سووکی، ریسوایی

**ضرغام:** شێر، شێری دڕندە، بەهێز، ئازا، دلێر، بوێر، چاونەترس

**ضرغامە:** بروانە ضرغام

**ضرغم:** شێر، شێری دڕندە

**ضرم:** ئایسان، داگیرسان، پێ بوون، هەڵگیرسانی ئاگر، گەرم بونی شتێك، بڵێسەداربون

**ضرم:** بێچوە هەڵۆ، بەچکە هەڵۆ

**ضرور:** پێویست، نیاز

**ضرورات:** بروانە ضرورت

**ضرورت:** نیاز، پێویستی، پێداویستی، ناچاری، گەرەك

**ضروري:** ناچاری، بە پێویستی، بەناچاری، نیاز، ئەوەی پێویست و نیاز بێت

**ضروریە:** بروانە ضروري

**ضره:** ١- نیاز، پێویستی، نچاری، پێداویستی ٢- سەختین بەدبەختی، تەنگ دەستی ٣- ئازار، زیان، زەرەر ٤- گوان، گۆهان، بن گوان

**ضریب:** شێوە، جۆر، چەن، شێواز، وەك، هاوتا

**ضریبە:** ١- سرشت، سروشت، خوو، خەدەن عادەت ٢- خەراج، جەزیە، زەریبە،

**ضریح:** قەبر، گۆڕ، ئارامگا، مەزار، چوارچێوەیەکی دارین یا کانزایی کون کون کەلەسەر گۆڕ هەڵیدەبەستن

**ضریر:** ١- کوێر، نابینا ٢- نەخۆش، لەڕ، داڵگۆشت، کەم گۆشت

**ضریره:** بروانە ضریر

**ضریع:** مەم زل، مەم شۆڕ، ئەوەی مەمکی زل و شۆڕی هەیە

**ضریم:** ١- ئاگرکەوتنەوە، ئاگر، ئاتش ٢- سووتاو، سوتیاگ، سووتیاو

**ضعف:** سست بون، ناتەوان بوون، سستی، ناتەوانی

**ضعف:** دووبەرابەر، دو ئەوەندە، دو ئەونە، دووبەرابەری شتێك یا زیاتر

**ضعیف:** سست، بێهێز، ناتەوان، کەم توانا، لاواز، ئەوەی جەستەی لاوازە، لەڕ، لاغر، بچوك، رەقەڵ، تەشك، کەم تین، زراف

**ضعیف شمردن:** بە کەم زانین، بەلاواز هەژمار کردن، بەناتەوان زانین

**ضعیفە:** زەعیفە، ژنی بێهێز و ناتەوان

**ضغط:** گووشین، پاڵ پێونان، زەخت لێکردن، کوتان، تەنگ پێ هەڵچنین

**ضغطە:** سەختی، تەنگی، گووشار، زەخت، رەنج

**ضغن:** رق هەڵگرتن، رق گرتن، کینە، رق لەدڵ گرتن، خۆخواردنەوە

**ضغینە:** رق، کینە، بوغز

**ضفدع:** بۆق، قرپۆك

**ضفير:** ۱- بەستێن، کەنار دەریا ۲- بەنی بادراو

**ضل:** گوومڕایی، لەناوچوون، فیرۆیی

**ضلال:** گووم بون، گومڕابوون، ڕێ ون کردن، لەڕێ دەرچوون، گوومڕایی

**ضلالت:** گوومڕایی، گوومڕا بون، ڕێ ون کردن

**ضلت:** سەرگەردانی، سەرلێشێوان، سەرسوورمان، واق وڕمان

**ضلع:** کەلەکە، ئێسقانی کەلەکە

**ضلل:** گوومڕایی، لەڕێ دەرچوون

**ضلول:** گومڕا، لەڕێدەرچوو، ڕێ ون کردوو

**ضليع:** بەهێز، پڕ زۆر، زۆردار، پیاوی بەهێز و پڕ زۆر

**ضليعه:** بڕوانە ضليع

**ضليل:** گوومڕا، ڕێ ون کردوو، لەڕێ دەرچوو

**ضم:** کۆکردنەوە، خڕ کردنەوە، کەڵەکە کردن، کۆکردنەوەی چەند شتێك لەشوێنێك

**ضماد:** مەڵهەم، مەرهەم، مەڵحەم، مەڵهەمی برین. ئەو پەڕۆیەیی برینی پێ دەبەستن

**ضمار:** شاراوە، فەشارپاو، نهێنی، داشارپاو، ماڵی شاراوە کەهیوای دەست پێگەشتنی نەبێت. ناوی بوتێك بوە لەسەردەمی نەزانی عەرەب

**ضمان:** ڕازی بون، قبوڵ کردن، لەئەستۆ گرتن، لە ئۆدە گرتن

**ضمانت:** ۱- تووش بوون، گیرۆدە بوون بەنەخۆشی کە کات کات توند کەکات کات پەرە دەسێنێت و دەبێتە هۆی زەوی گیربون ۲- دەستەبەری، لەئەستۆ گرتن، لەئۆدە گرتن

**ضمر:** ئەندام ڕێك، بەژن ڕێك

**ضمره:** ژنی ئەندام ڕێك، شۆخ و شەنگ، بەژن ڕێك

**ضمن:** ناو، ناڤ، ناوی شتێك، نێوان، لەناو

**ضمن:** لەجێدا مانەوە، ناتەوان بوون، زەوی گیر بوون، پەك کەوتن، پەککەوتەیی، زەوی گیری

**ضمن:** پەك کەوتە، زەوی گیر، لەجێدا کەوتوو

**ضمور:** کەم گۆشت، داڵگۆشت، لەڕ، کز، لاواز، لاغر، تەشك، ڕەقەڵ، باریك،

**ضمير:** ناخ، ناخی مرۆڤ، ویژدان، ئەندێشەی و نهێنیەکانی ناودڵ، پڕونێو

**ضميم:** خاوەن، هاوڕێ، هاوەڵ

**ضميمه:** ۱- خاوەن، هاوڕێ، هاوەڵ، پەیوەستن پاشکۆ، شتێك کەبەشتێکیترەوە پەیوستی بکەن

**ضمين:** ۱- لەئەستۆ گرتوو، ئۆدەدار، دەستەبەر، دەسەبەر ۲- پەك کەوتە، لەجێدا کەوتوو، زەوی گیر

**ضنت:** بەخیلی، درێغی، درێخی

**ضنين:** بەخیل، ڕەزیل، ڕژد، ناکەس، ناپیاو

**ضوء:** نوور، تیشك، تیرۆژك، ڕووناهی، ڕووناکی، ڕۆشنایی

**ضوضاء:** دەنگەدەنگ، هاتوهاوار، قەرەباڵغی، دەنگە دەنگی خەڵك لەکاتی شەڕدا

**ضومر:** پۆپنە کەڵەشێر، گوڵی پۆپنە کەڵەشێر

**ضياء:** نوور، ڕۆشنایی، ڕووناکی، تیشك، ڕووناهی

**ضياع:** زەوی کشت و کاڵی

**ضيافت:** میوانی، مێهڤانی، میوانداری، میوان بوون

**ضياگستر:** نووربەخش، ڕوناکی بەخش، تیشك بەخش

**ضيزن:** زیزن، ناوی بوتێك بوە لەسەردەمی نەزانی عەرەب

**ضيغم:** گازگر، پێوەدەر، شێر، شێری دڕەندە

**ضيغمي:** شێر، شێری دڕەندە

**ضيف:** میوان، مێهڤان، مێمان، مەهوان

**ضيق:** تەنگی، سەختی، دژواری

**ضيق:** تەنگ، تەنگەبەڕ، تەسك، پێچەوانەی پان و بەرین

**ضيق النفس:** تەنگی هەناسە، ناسم، هەناسە تەنگی کە مرۆڤ بە دژواری هەناسە دەکێشێت

**ضيقت:** خراپحاڵی، هەژاری، دەسکورتی، نەداری، دەست تەنگی، نیازمەندی

**ضيم:** زوڵم، ستەم، ناحەقی، ئەستەم

**ضيوف:** میوانەکان، مێمانەکان، مەهوانەکان

# ط

**ط**: ت، پیتی نۆزدەیەم لە ئاڵفابێتی فارسی. ئەم پیتە لە زمـانی کوردیـدا نیـە و لـەجیاتی ئـەم پیتـە پـیتی (ت) بەکار دەبرێت

**طائر**: باڵندە، هەڵفڕ، هەر ئاژەڵێك پـەر وبـاڵی هـەبێت، مەل، پەلەوەر، باڵدار

**طائره**: تەیارە، فڕۆکە، فڕۆك

**طـائش**: کـەم عـەقڵ، بـێ مێـشك، نـەزان، زلحۆل، گێـژ، کاس، وڕ

**طائع**: فەرمانبەردار، گوێ ڕایەڵ، ملکەچ

**طــائف**: ١- تــەواف کــەر، ئــەوە بــەدەوری شــوێنێکدا دەسووڕێتەوە. ٢- حەسحەس، شەوگەڕ

**طائفـه**: تایەفـە، تـیرە، هۆبـە، زۆم، ڕەچـەڵەك، هـۆز، بەرەباب، بەرە، خێڵ

**طائل**: دەسەلات، هێز، زۆری، توانایی، سوود، قازانج

**طائلـه**: ١- دەسـەلات، توانـایی، هێـز، بەرزەوەنـدی ٢- کینە، ڕق، دوژمنی

**طاب**: حەلاڵ، پاك، خاوێن، خۆش، پاقژ

**طاباق**: خشت، کەرپووچ، خشتی گەورە

**طابخ**: ١- چێشت لێنەر، تـەباخ، ئاشپەز ٢- تـا، گـەرمی لەش

**طــابع**: ١- چــاپکەر، مۆرکــەر، واژۆکــەر ٢- سرشــت، سروشت، خوو، خەدە

**طابع**: ئەنکوستیلە، کلکەوانە، مستیلە، مۆر، هەر شتێك کەنیشان و هێمای لەسەر شتێك پێ دیاری بکەن

**طابق**: ١- تاوە، دەفرێك کەشتی تیـا سووردەکەنەوە ٢- خشتی گەورە، کەرپوچ

**طاجن**: تاوە، ئەوە دەفرەی خواردنی تیا سووردەکەنەوە

**طاحون**: ئاش، ئاساو، ئاسیاو، شوێنی گەنم ئارد کردن

**طاحوني**: ئاشی، ئاسیاوی، تایبەت بە ئاش

**طارف**: ماڵی نوێ، ماڵی تازە بەدەست هاتوو

**طارقـه**: ١- بـەلا، ڕووداو، کارەسـات ٢- هـۆز، نەتـەوە، خێڵ، بەرەباب

**طـارم**: هـەیوان، بەرهـەیوان، داربەسـتی هـەیوان، مـاڵی دارین، گومەز

**طاريء**: کتاوپڕ، لەناکاو، کتوپڕ

**طاريه**: بەلا، کارەسات، پێشهاتی لەناکاو

**طاس**: تاس، کاسەی مسین، دەفری مسین

**طاس**: تاس، بێ مو، کەچەڵ، کەل، ئەوەی تووکی سەری رووتابێتەوە

**طاس**: زار، تاس، مۆریەك شەش لا کەهەر شەش لاکەی خاڵی یەك تا شەشی لەسـەرە و لـەیاری تاوڵە و هەنـدێ یاریتردا بەکار دەبرێت

**طاسباز**: تاسباز، زارباز، ئەوەی یاری بەزار دەکات

**طاع**: فەرمانبردار، گوێ ڕایەڵ

**طاعــت**: فــەرمان بــردن، گــوێ ڕایــەڵی کــردن، فەرمانبرداری، سەردانەواندن

**طاعت پيشه**: فەرمانبردار، گوێ ڕایەڵ، ملکەچ

**طاعت ور**: بڕوانە **طاعت** پیشە

**طاعن**: لۆمەکەر، سەرزەنشتکەر، تانەلێدەر

**طـاعون**: تـاعون، ئـازار، ئـاهۆ، چاوقووڵکە، قـڕان، دەرم، نەخۆشـینێکی مـرۆڤ کـوژە کـە میکرۆبەکـەی لەسـاڵی ١٨٩٤ لەلایەن یرسن دۆزرایەوە

**طاغوت**: سـەرکێش، ملهوڕ، زۆردار، بت، بـوت، شـەیتان کــە مــرۆڤ لــەرێگای ڕاســت دووردەکاتــەوە. هــەر پەرستراوێك جگە لەخوا

**طاغي**: سەرکێش، زۆردار، ملهوڕ، زاڵم، ستەمکار

**طاغيه**: ستەمكار، لەخۆڕازی، لەخۆبایی، ئەحمەق، نەزان

**طافح**: سەرخۆش، مەست، مەست لەشەراب

**طافحه**: ١- مەست، سەرخۆش، ٢- وشك، وشك لەهەر شتێك

**طاق**: تاق، سەقفی چەماوە، سەقفێكی چەماوە كەبەخشت لەسەر درگا یا پرد دروستی دەكەن

**طاق**: ١- تاق، تەنیا، تەك، یەك پێچەوانەی جووت ٢- تەنیان تاقانە، بێ هاوتا، بێ وێنە

**طاق ازرق**: ئاسمان، تاقی ئاسمان

**طاقباز**: بەپشتا خەوتو، راكشاو

**طاقت**: تاقەت، توانایی، یارا، تاو، راوەستاویی، خۆڕاگری، بەرگەگرتن، توانا، سەبر

**طاقت آوردن**: تاقەت هێنان، بەرگە گرتن، خۆڕاگری كردن

**طاقت داشتن**: تاقەت بون، خۆڕاگری، بەسەبر بون، بەرگە گرتن

**طاقت رسیدن**: تاقەت نەمان، سەبر نەمان، بەرگە نەگرتن، خۆڕانەگەرتن

**طاقت شكن**: وزەبڕ، هێزبڕ، ئەوەی هێز و تاقەت لەمرۆڤ بستێنێت

**طاقت فرسا**: بڕوانە **طاقت** شكن

**طاقت یافتن**: خۆڕاگرتن، بەرگە گرتن، تاقەت هێنان

**طاقچه**: تاقچە، تاق، تاقی بچوك، فوونەبان، ڕەفە، دۆلاب، رفە

**طاقه**: تاڵ، تار، تاڵێك موو، دەستەیەك موو، چەپك، چەپكێ

**طاقي**: تەقیلە، تەقلە، تاقیلە، عارەقچن، كڵاو، كڵاوی درێژ هاوشێوە كڵاوی دەروێشان

**طالار**: تالار، هۆڵ، هۆڵی گەورە

**طالب**: خوازیار، تامەزرۆ، داواكار، خواستەر، خوازۆك، قوتابی، خوێندكار

**طالبي**: گركە، گندۆرە، كاڵەك، میومیەك لەجۆری شووتی كە یەك دومانگ زووتر لە شوتی پێدەگات

**طالح**: خراپەكار، بەدفڕ، شەڕن شەڕانی، شەرخواز، خراپەویست

**طالع**: ١- هەڵاتوو، ئەوەی هەڵدێت وەك هەتاو ٢- مانگ، مانگی تازە ٣- شانس، بەخت، سەربوردە، چارەنوس

**طالع بين**: فالگر، فاڵچی، فاڵبین، ئەوەی بەهۆی كتێب و قاوە و شتیتر فاڵ بۆ كەسانیتر دەگرێتەوە

**طالع مند**: بەختەوەر، بەبەخت، خۆشحاڵ، كامەران، خۆشبەخت

**طالع ميمون**: شانسی پیرۆز، بەختی باش

**طالق**: تەڵاقدراو، ژنی تەڵاقدراو و رزگاربوو لەمارەیی

**طالوت**: تالووت، ناوی پیاوێك لەبەنی ئیسرائیل كەبەپێی گێڕانەوەی موسوڵمانەكان باوكی ژنەكەی داوود و لەمناڵەكانی یەعقوبە و شەڕی جالوتی كرد

**طامات**: كارەسات، ڕووداوی گەورە و دڵتەزێن، بەڵا، سەختی، دژواری

**طامح**: ١- نافەرمان، ژنێك كە بێ مۆڵەتی مێردەكەی بڕواتە لای پیاوانیتر ٢- بڵند، بەرز، بەرز و بڵند لەهەر شتێك

**طامع**: تەماحكار، تەماحدار، چاوچنۆك، رژد، چاوچنۆك

**طامعه**: بڕوانە **طامع**

**طامه**: بەڵا، بەڵای سەخت، كارەسات، بەڵایەك كەلەهەمو بەڵاكانیتر قورس تر و دژواتر بێت

**طاووس**: تاوس، داوس، مەلێكی جوان و پەڕ رەنگینە

**طاووس فش**: وەك تاوس، تاوس ئاسا، هاوشێوەی تاوس

**طاووس وار**: بڕوانە **طاووس فش**

**طاووسي**: تاوسی، سەز رەنگ، بەرەنگی سەوز، بەرەنگی تاووس

**طاهر**: پاك، خاوێن، پاقژ، بێگەرد

**طاهره**: پاك، ژنی پاك، پاك لە پیسی و عەیب

**طاير**: بڕوانە **طاير**

**طايفه**: بڕوانە **طايفه**

